# ڕێنووس و خوێندنەوەی کوردی
# بە شێوەی زانستی



## بەشی (٢)

نووسەر : مستەفا ئێلخانی‌زادە

## ***«ڵ» قەڵەو (درشت) و «ل» لاواز (خفیف)***

در کُردی دو نوع **ل** داریم یکی **ل** لاواز که تلفظ آن همانند **ل** در زبان فارسی است مانند: لیو ـ مل ـ بلویر ـ کل.

دیگری **ڵ قەڵەو** که در فارسی وجود ندارد و مخصوص کُردی است و در زبانهای ترکی آذربایجانی و انگلیسی وجود دارد مثال کُردی : ماڵ ـ کاڵ ـ کوڵیو ـ کوڵەکە ـ شاڵاو.

برای تشخیص (ڵ) **قەڵەو** از **ل** لاواز بر روی آن علامت (˅) قرار می‌دهیم. در زبان تُرکی آذربایجانی این تلفظ وجود دارد مانند: **ماڵ و کاڵ** و در زبان انگلیسی هر گاه دو حرف LL پشت سر هم بیایند تلفظ مشابه **ڵ قەڵەو** کُردی را ایجاد می‌نمایند مانند: **SHALL - CALL**.

حرف (ل) **قەڵەو** یا درشت هیچوقت در اول کلمات نمی‌آید و تمام (ل) اول کلمات ل لاواز یا خفیف است مانند: **لێو ـ لوورە .**

**باب و کاڵت بە نەزانی مردن — بیری سەربەرزییە وای لێکردن**
**هەر کەسێ بەرزە فڕە زوو دەمرێ — بای بڵندایی سەر و دڵ دەگرێ**
**ماڵی ئێوە کە لووتکەی کێوە — لای جن و دێوە بەڵای زۆر پێوە**

**«هەژار»**

## حرف [(ڕ) (**قەڵەو** – درشت)]

چنانچه نوک زبان به ابتدای سقف زبان چسپیده و به پشت دندانهای فوقانی برسد، تلفظ این حرف ممکن خواهد بود، در حالیکه برای تلفظ [(ر) **لاواز** – **خفیف**)] می‌بایست نوک زبان را به پشت دو دندان وسط بالایی نزدیک کرد.

در زبان کُردی همه کلماتی که با حرف (ر) شروع می‌شود حتماً (ڕ) درشت است عده‌ای را عقیده بر این است که برای حفظ زیبایی کلمه بهتر است علامت (ˇ) بر روی (ر)های اول کلمات گذاشته نشود ولی عده‌ای معتقد هستند (ˇ) از اختصات (ڕ) **قەڵەو** یا درشت می‌باشد و باید بر روی (ڕ)های اول کلمات نیز علامت (ˇ) گذاشت البته امروزه بخاطر مسایل حروفچینی علامت (ˇ) را در زیر (ڕ) قرار می‌دهند.

چند مثال برای ڕ درشت: ڕۆژ ـ ڕێوی ـ کوڕ ـ غەڕغەڕە.

**ئەو هەموو زولفە بە زنجیری مەکە بۆ منی هەژار**
**پیرە کەروێشکێ لە گوڕ کەوتبێ ڕاوێکی بەسە**

# *میرزا برایم(ی) ئەفخەم*

**شاعیر و نووسەری کورد، لە ساڵی ١٣٠٠ی کۆچی هەتاوی لە شاری بۆکان لە دایک بووە. خوێندنی خۆی لە لای برای گەورەی میرزا عەبدوڵڵا(ی) ئەفخەم دەسپێکردووە و پاشان موقەددەماتی سەرف و نەحو و ئەدەبی فارسی لە لای برای زانای حاجی مەلا هادی ئەفخەمزادە خوێندووە و لە ساڵی ١٣٢٦ وەک فەرمانبەر لە ئیدارەی دارایی دامەزراوە و لە ساڵی ١٣٦٣ لە شاری بۆکان خانەنشین کراوە و لە ساڵی ١٣٧٤ هەر لەو شارە کۆچی دوایی کردووە.**

**میرزا برایم مرۆڤێکی ماندوو نەناس و دڵسۆز بووە و لە ماوەی ژیانی خۆیدا هەوڵێکی زۆری بۆ کۆکردنەوەی مێژوو و جوغرافیا و کەلەپووری گەلەکەی داوە و توانیویەتی ئەم بەرهەمە بە نرخانە بخوڵقێنێ :**

**١ـ دیوانی ئەفخەمی (شێعر)**
**٢ـ دیاری نوێ (شێعر)**
**٣ـ تاریخ فرهنگ و ادب موکریان(بوکان)**
**٤ـ تاریخ و فرهنگ و ادب مکریان (مهاباد - اشنویه - سردشت)**
**٥ـ قیام ملا خلیل و رد فرمان رضاخان**
**٦ـ قیام سمایلئاغا شکاک**
**٧ـ بنەڕەتی مەتەڵی کوردی (لێکۆڵینەوە)**
**٨ـ ئەوە چیە (فۆلکلۆر)**
**٩ـ فیقهی شافیعی بە هەڵبەست.**

**ئەم شاعیرە بۆ یەکەم جار لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا لە بەشێکی زۆر لە شێعرەکانیدا بە شێوەی تەنز(گەپ و گاڵتەجار) ڕەوشت و ئاکاری خراپ و دزێوی کۆمەڵگا دەخاتە بەر پرسیار و پەلامار، و دەکرێ بکوترێ، داهێنەری ئەم شێوە شێعرە بەڕێز میرزا برایم(ی) ئەفخەمی بێ. لە بنەڕەتی مەتەڵی کوردیشدا سەرچاوە و بنچینەی بەشێک لە مەتەڵە کوردییەکان روون دەکاتەوە.**

# تمرينات درس هفتم

۱ـ چرا همزه يک حرف بيصدا است؟

۲ـ ده کلمه بنويسيد که در آن همزه وجود داشته باشد؟

٤ـ اين کلمات را با رسم‌الخط کُردی بنويسيد:

آرد(　　　)　　آش(　　　)　　اخلاق(　　　).

ابدأ(　　　)　　اُرگان(　　　)　　مأيوس(　　　)

۵ـ پنج کلمه بنويسيد که (ر) خفيف(لاواز) در آن وجود داشته باشد.

٦ـ پنج کلمه بنويسيد که (ڕ) درشت(**قه‌ڵه‌و**) در اول آن باشد و پنج کلمه بنويسيد که (ڕ) درشت(**قه‌ڵه‌و**) در وسط يا آخر آن باشد.

۷ـ ده کلمه بنويسيد که در آنها حرف (**ڤ**) بکار گرفته شده باشد.

۸ـ ده کلمه بنويسيد در آنها حرف [**(ل) خفيف. لاواز**] به کار گرفته شده باشد.

۹ـ ده کلمه بنويسيد که در آنها از [**(ڵ) درشت – قه‌ڵه‌و**] استفاده شده باشد.

# کلمات خارجی که در زبان کُردی وارد شده‌اند چطور باید نوشته شوند؟

در زبان کُردی از زبانهای دیگر و بیشتر از همه از زبان عربی کلمه وارد شده است. حال باید این کلمات با چه رسم‌الخطی نوشته شوند.

چنانچه قبلاً گفتیم تعدادی از حروف مخصوص عربی مانند: ط ـ ظ ـ ض ـ ذ ـ ث ـ ص. در زبان کُردی چنین نوشته می‌شوند.

| به عوض | ط | ت |
|---|---|---|
| به عوض | ظ.ض.ذ | ز |
| به عوض | ث.ص | س |

نوشته می‌شود و بجای اعراب از حروف استفاده می‌کنیم یعنی به جای فتحه از «ـە» بجای کسره از «یَ» و بجای ضمه از (ۆ) استفاده می‌کنیم و با توجه به نکات بالا تقریباً ٥٠٪ نوشتن رسم‌الخط کُردی را آموخته‌ایم.

در مورد نوشتن کلمات عربی در زبان کُردی دو نظریه ارایه شده است. یکی اینکه کلمات عربی که حروف مخصوص

ربی دارند با همان حروف نوشته شده و در نوشتن آنها از قواعد مخصوص رسم‌الخط عربی استفاده شود که البته به عقیده ما این طرز نوشتن درست نیست زیرا در نوشتن یک زبان فقط باید از یک نوع الفبا استفاده شود این غلط در نوشتن زبان کُردی با الفبای لاتین بیشتر محسوس است برای مثال کلمه عربی صلح با رسم‌الخط کُردی با الفبای عربی **سوڵح** و با الفبای لاتین **sulĥ** نوشته می‌شود که چون الفبای لاتین و کُردی از لحاظ شکل کاملاً جدا هستند این تفاوت به خوبی آشکار بوده و لزوم نوشتن کلمات عربی با الفبای کُردی را بخوبی مشخص می‌سازد.

در مورد نوشتن تشدید در زبان کُردی چون در نوشتن زبان کُردی کاملاً از شیوه‌ی فونتیک استفاده می‌شود و کلمات چگونه تلفظ می‌شوند همانگونه هم نوشته می‌شود در بخش کردن کلمات مشدد تکرار حرف مشدد کاملاً محسوس است پس باید به جای نوشتن تشدید بر روی حرف آنرا دوبار نوشت مانند:

بزّاز ——— بەززاز

عبدالله ——— عەبدوللا

مصلح‌الدّین ——— موسلیحوددین

در کُردی کلمات مشدد کم داریم و می‌توان در نوشتن کلمات مشدد که کُردی هستند هم با تکرار حرف و هم بدون آن نوشت مانند: خللۆر خلۆر

در نوشتن کلمات بیگانه هر کلمه‌ای که از زبان بیگانه وارد کُردی شود باید تمام قواعد زبان کُردی (از لحاظ فونولژی ــ مورفولوژی و اورتوگرافی) (فونتیک ـ صرف‌ونحو و رسم‌الخط) را بپذیرد مثلاً کلمه‌ی تەماتە انگلیسی که تغییر یافته‌ی تومیتۆی انگلیسی یا تەواو که تغییر یافته‌ی تمام عربی و ئاقڵ که تغییر یافته‌ی عاقل عربی است از نظر ساختاری تغییر پیدا کرده و به مرور در زبان کُردی تثبیت شده‌اند همچنین اگر برای چیزی دو کلمه بیگانه و خودی باشد باید از کلمه‌ی خودی استفاده شود.

۱ـ در بعضی از لهجه‌های کُردی چنانچه حرف «ک» در جلو یکی از حروف(ی ـ ێ ـ وێ) قرار گیرد تلفظی مابین (ک‌وچ) پیدا می‌کند که به آن ک کلۆر(اجوف) می‌گویند مانند:

کیسه ـ کیله ـ کێرد ـ کوێر ـ کوێستان

همچنین (گ) نیز اگر در جلو حروف(ی ـ ێ ـ وی) قرار گیرد تلفظی میان (گ و چ) پیدا می‌کند مانند:

گیسک ـ گیشه ـ گێره ـ گوێنی ـ هەنگوین ـ نێنگوین.

# سەیدتاهیر هاشمی

شاعیر، لێکۆڵەر و خەتخۆشی بەناوبانگی کورد، بە گوێرەی نووسراوی خۆی لە کتێبی «هەوارگەی دڵان»دا لە ساڵی ١٣٣٢ای کۆچی مانگی لە دێی دموڵەتئاوا سەر بە ناوچەی رەوانسەری شارستانی پاوەی پارێزگای کرماشان لە دایک بووە. باوکی «سەید قەیدار» لە بنەماڵەی ساداتی سۆڵەیی بەرزنجی و دایکی «ئەختەر خانم» کچی فەتاح بەگی سەردار ئەکرەم لە بەگزادەکانی جافی جوانڕۆن.

لە دموڵەتئاوا لە لای مەلا رەحیمی سنەیی و برای گەورەی خۆی سەید وەجیهەددین و مەلا فەیزوڵڵای دۆڵاویی خوێندوویەتی و لە تەمەنی شازدە ساڵیدا دەستی بە کوتنی شێعری فارسی و کوردی کردووە و بووەتە شاعیرێکی باش و لەگەڵ بەرنامەی کوردی رادیۆ کرماشانیش هاواکاری کردووە و بەرنامەیەکی بە ناوی هەوارگەی دڵان پێشکەش کردووە و وتارێکی زۆریشی سەبارەت بە شێعر و ئەدەب نووسیوە. بە تایبەت لە شیکردنەوەی شێعرەکانی مەولەوی تاوگۆزی زۆر شارەزا بووە و لە ساغ کردنەوە و مانالێدانی شێعرەکانی مەولەوی یارمەتی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیسی داوە بۆ ئامادە کردنی دیوانی مەولەوی.

دوو کتێب لە شوێنەوارەکانی ئەو زانایە بە ناوەکانی هەوارگەی دڵان(شێعر) و «مناقب اهل بیست از دیدگاه اهل سنت» چاپ کراون.

ئەو زاتە خەتخۆشێکی بە ناوبانگیش بووە و چەند کتێبێکی بە خەتی خۆشی خۆی نووسیوەتەوە کە یەک لەوان کتێبی: «دەلایلولخەیرات»ە

سەید تاهیری سەیدزادەی هاشمی لە رێکەوتی ١٣٧٠/٤/٢ رۆژی جێژنی قوربان لە شاری کرماشان کۆچی دوایی کردووە. و تەرمەکەی لە دموڵەتئاوا نێژراوە.

بەشی دووهەمی

خوێندنەوەی وانەی ٨

# هاوارەبەرە

هاوارەبەرە ڕۆمانێکە بە شێوەی ڕیالیستی. کاک فەتاح(ی) ئەمیری نووسەری بۆکانی ئەو ڕۆمانەی نووسیوە. هاوارەبەرە ڕووداوێکی تایبەت بە بەشێک لە نیشتمانەکەمان دەگێڕێتەوە و پڕە لە وشەی جوان و ڕەسەنی لادێیەکانی موکریان. ئەو ڕۆمانە لە دوو بەرگدا چاپ کراوە و بەرگی دووهەمی لە لایەن نووسەرەوە «میرزا» ناو نراوە. زمانی ئەو ڕۆمانە زۆر شیرین و پاراوە و کاک فەتاح جگە لەوەی خوێنەران فێری زۆر وشە و زاراوەی تایبەتی گوندەکان دەکا، وشەگەلێکی زۆریش کە پێوەندییان لەگەڵ کەرەسە و ئامرازی کشت و کاڵ و ئاژەڵداری لە ڕابوردوودا بووە لە فەرامۆش بوون و نەمان ڕزگار دەکا.

لێرەدا بۆ نموونە چەند دێڕێک لەو کتێبە بە نرخە دەخەینە بەرچاوی خوێندکاران:

نیوەڕۆی ڕۆژێکی مانگی بانەمەڕە، مەڕ لە پاڵێن دایە، مەڕ پشتی گەرم داهاتووە، شوان خەریکی نان خواردنە، ریخە مەڕ وڵاتی داگرتووە، جیڕجیڕ عەرزی خاوێن بە دەرەوەیە گەرچی تینی تاو کزری کردووە، دیسان ڕۆیشتن بە نێو دێدا ئاسان نییە، مەڕ بە تەواوی تەڕەکی گرتووە، ڕێتکە بە بن پێڵاوەوە نووساوە، بۆنی بەهار، تاوی بەهار، مردوو زیندوو دەکاتەوە، چۆلەکەیەک جیکەجیک دەکا، پۆلێک مێشە سەگانە قەڵسە لە سەگێکی کوڵکن دەگێڕن، ناهێڵن چاوێک گەرم کا... یارە جل و جۆری تێک ناوە بەرەو سەحرا بێ، هاوێری کردووە، نانی خواردووە، مەحتەلی ئەوەیە، مەڕ هەستێ پاشان وەڕێکەوێ. بەرخ بۆر بوون. مەچەک ئەستوور، ڕەنگی بەرگنەکەیان گۆڕاوە. تاو ڕەنگی گۆڕیوە. ڕەنگی ساوایی نین. لەوەڕ زووری کردوون، هێندێک چڵمن بوون، بەعزێک ریخن. ئەوانی ساوازێ هەروا ژێکەڵەن. سەحەت سووک، خاوێن، نەرم و نۆڵ، سەرپشتیان لەبەر خاوێنی شەبەق دەدا. بەرگنی نەرم و لوولوو، سمی وردی زەرد، خەپاڵ، قشمیلانە.

# تمرینات درس ۸

۱ـ کلمات بیگانه در زبان کُردی چگونه نوشته می‌شوند و آیا این مختص زبان کُردی است؟

۲ـ کلمات زیر را با رسم‌الخط صحیح کُردی بنویسید.
**عبدالمطلّب ـ صلاح‌الدّین ـ توحفة‌المُریدَین ـ عبدالرَزّاق**

۳ـ حروفی که دارای تشدید می‌باشند در کُردی به چه صورت نوشته می‌شوند ۵ مثال بنویسید.

٤ـ (ک) کلۆر را توضیح داده و برای آن ۳ مثال بیاورید.

۵ـ (گ) کلۆر را شرح داده و برای آن ۳ مثال بنویسید.

# خودآزمایی(۱)

۱ـ در این جمله بر روی حروفی که لازم است علامت (ˇ) بگذارید.
کوریکی ئازا له چومی مەلەی دەکرد و کالەکی دەخوارد.

۲ـ در این عبارت چند حرف صدادار وجود دارد.
حوسێن عارف یەکێک له نووسەرانی گەورەی کوردە.
الف) ١٤ ☐ ب) ١٥ ☐ ج) ١٣ ☐ د) ١١ ☐

۳ـ در کدامیک از کلمات زیر بزرۆکه وجود دارد.
قرژاڵ ☐ کاوه ☐ چارەسەری ☐ شۆرباو ☐ شووتی ☐

٤ـ چرا حرف (ر) در کلمه ڕۆژان درشت است؟

٥ـ در کدامیک از کلمات زیر مصوت مرکب وجود دارد.
الف: خوێن ☐ ب: سوور ☐ ج: گوێزان ☐ د: دۆڵمه ☐

٦ـ حرف (و) در کلمەی «کەو» بیصدا است یا باصدا.

۷ـ حرف (ی) در کلمه شیوەن بیصدا است یا باصدا.

۸ ـ حرف (و) در کلمه گوڵ بیصدا است یا باصدا.

۹ـ حرف (و) در کلمه بانه و مەریوان بیصدا است یا باصدا.

۱۰ـ حرف (و) در کلمەی بارام و پیرۆت بیصدا است یا باصدا.

۱۱ـ در کلمەی (چووه) باید چند (و) وجود داشته باشد و چرا فقط با ۲ (و) نوشته می‌شود.

۱۲ـ در کلمەی چۆڵ و هۆڵ حروف صدادار کدامند بنویسید.

۱۳ـ در شعر پائین تعداد حروف صامت چندتا است.

**ماڵـــی ئێـــوه کـــه لـــه لووتکـــەی کێـــوه**
**جێـــی جـــن و دێـــوه بـــه‌ڵـــای زۆر پێـــوه**

الف: ۱۲ ☐ ب: ۱۳ ☐ ج: ۱۱ . ☐ د: ۸ ☐

۱٤ـ صدای (ق) به کدام حرف بیشتر نزدیکتر است.

## جدانویسی و سرهم نویسی کلمات

مبحث جدانویسی و سرهم نویسی کلمات مبحثی است که هم در زبان فارسی و هم در زبان کُردی در میان زبانشناسان و ادبا اختلاف رأی بسیار است. بخصوص در زبان فارسی این مقوله بسیار مفصل بحث شده و در کتب درسی هم به طور کلی تثبیت نشده و هنوز هم گاهگاهی تغییراتی در کتابهای دبیرستانی و دانشگاهی بر این اساس می‌دهند. در رسم‌الخط کُردی دو نظریه متفاوت از هم وجود دارد و برای درک بهتر این نظریات ابتدا لازم است به شرح انواع کلمه بپردازیم:

**۱ـ کلمه ساده** : کلمه‌ایست که از یک جزء تشکیل شده باشد و ممکن است مستقل باشد یعنی خود به تنهایی و

بدون کمک کلمه‌ی دیگـر دارای معنـی کامـل و مخـتص بـه خود باشد. معنی کامل از این نظر که به کمک کلمـه‌ی دیگـر برای داشتن معنی محتاج نباشد و مختص به خود یعنی اینکه این معنی فقط مخصوص خودش باشد مثلاً درخت که کلمـه ساده‌ی مستقلی است و در موقع شنیدن این کلمه جـسمی را که دارای ریشه و ساقه‌ی نسبتاً ضخیم و شاخه و برگ اسـت به نظر می‌آوریم که این صفات مختص به این جسم است.

کلمه مستقل نظیر:

وێنجه ـ دار ـ سپی ـ سینه‌ما ـ چوار ـ خه‌وتن ـ ئه‌و ـ زۆر.

چنانچه دقت کنیم یکی از اقسام کلمه هستند.

وێنجه و دار= اسم

سپی = صفت

ئه‌و = ضمیر

سینه‌ما = اسم

زۆر = قید

چوار = عدد

خه‌وتن = مصدر

**۲ـ کلمه‌ی ناقص :** به کلماتی گفته می‌شوند که به تنهایی دارای معنی نیستند و با کمک کلمات دیگر د جمله ادا می‌شوند مانند :
ادوات الحاقی ـ حروف اضافه ـ حروف عطف ـ ندا ـ نشانه.

**۳ـ کلمه مرکب :** کلمه‌ایست که از دو کلمه‌ی مستقل ساده یا یک کلمه مستقل ساده و یک کلمه ناقص تشکیل شده باشد که در حالت اول در کُردی به آن وشه‌ی لێکدراو و در حالت دوم به آن وشه‌ی دارڕژاو می‌گویند.
مثال برای کلمه مرکب که از یک کلمه ناقص و یک کلمه مستقل درست شده باشد(دارڕژاو) : بێده‌نگ ـ باشتر.
حال که با کلمات مستقل، ناقص و مرکب آشنا شدیم به شرح نظرات مختلف درباره‌ی جدانویسی و سرهم نویسی و نظر خودمان می‌پردازیم :
هر واژه‌ای که معنی مستقلی دارد باید بصورت جداگانه نوشته شود و واژه‌ای که دارای معنی ناقص است و با اضافه شدن با واژه‌ی دیگر صاحب معنی می‌شود و یا با پیوستن به واژه‌ی مستقلی معنی دیگری به غیر از معنی واژه‌ی مستقل

که به آن اضافه شده بوجود می‌آورد باید بصورت سرهم نوشته شود. لازم است در مورد سرهم‌نویسی و جدانویسی کلمات موارد زیر رعایت کنیم :

۱ـ افعال ساده در جمله بصورت جداگانه نوشته می‌شوند مانند :

پیرۆت لە بارامی دا

نیشتمان ڕۆیشت

رزگار کاری کرد

۲ـ کلمات مرکبی که از دو جزء معنی‌دار مستقل بوجود آمده‌اند و پس از ترکیب معنی تازه‌ای به وجود می‌آورند باید سرهم نوشته شوند.

ڕێ + پێوان = ڕێپێوان

گوێ + گرتن = گوێگرتن

۳ـ پیشوند (پێشگر) و میانوند (نێوانگر) و پسوند (پاشگر) به کلمه می‌چسپند.

مانند : بێکەس ـ لێدوان ـ چاوپێکەوتن ـ کارتێکردن ـ لەوێدا‌ـ مسگەر.

٤ـ صفت تفضیلی (ئاوەڵناوی سەری) به اسم پیش از خود می‌چسبد مانند : چاکتر ـ خۆشتر ـ قووڵتر ـ ترسەنۆکتر.

چنانچه (تر) به معنی دیگر باشد باید جدا نوشته شود مانند : کارێکی تر ـ بەرخێکی تر ـ ماڵێکی تر ـ جارێکی تر.

٥ـ حرف عطف (و) که کلمات یا عبارات و جملات را بهم مربوط می‌کند به کلمه پیش از خود نمی‌چسبد.

مانند : بانه و مەریوان خۆشن ـ ڕێبین و ئاسۆس بران.

ولی اگر حرف عطف (و) باعث بوجود آمدن معنای تازه‌ای در کلمه‌ی مرکبی که با کمک حرف عطف (و) بوجود آمده است، شود (و) به کلمه ماقبل خود می‌چسبد.

مانند : خرینگوهۆڕ ـ زرموکوت ـ نەرمونۆڵ .

٦ـ (ی) اضافه باید به کلمه پیش از خود بچسبد.

مانند : بۆکانی ـ عیرفانی ـ خواردەمەنی

# هێـدی

ئەو شاعیرە ناوی خالید کوڕی حاجی حەمەدئاغا، کوڕی حاجی عەوڵـاغا و لە عەشیرەتی دێبوکرییە و لە ساڵی ١٣٠٦ی هەتاوی لە دێی شێخاڵی سەر بە شاری مەهاباد لە دایک بووە و لە گوندی شێخاڵی و شاری مەهاباد خوێندوویەتی و شارەزاییەکی تەواوی لە ئەدەبی فارسی و کوردی پەیدا کردووە و هەر لە سەرەتـای لاوییەوە شێعری کوتـووە. هێدی لـە ساڵـی ١٣٤٣ی هەتاوی پەڕیوەی کوردستانی عێراق بووە و لە ریـزەکـانی شۆڕشی کوردستانی ئەودیودا دەستی بە خەبات کردووە و ماوەیەکی زۆر لە ئێزگەی شۆڕش و کاروباری رووناکبیری کـاری کـردووە و پـاش تێکچوونی شـۆڕش گەڕاوەتەوە ئێران و لە عەزیمییەی کەرەج نیشتەجێ بووە و پاشان لەسەر داخوازی کاک مەسعوود بارزانی چووە بـۆ کوردستانی عێراق. ئێستا لـە شاری هەولێر دەبێ و ئەندامی کۆڕی زانیاری کوردە و لـە لایـەن سـەرۆکی حکوومەتی هەرێم پلەی هاوتای وەزیری پێدراوە.
هێدی شاعیرێکی بە هەست و ناسک خەیاڵە و لە بواری شێعری جوانی و عاشقانە بێوێنـەیـە و شێعری نیشتمانیشی زۆر کوتووە. بـەرهـەمـی چـاپکراوی ئـەو شـاعیرە مـەزنـە سێ کتێبی: کـاروانی خـەیـاڵ(شێعر) ئاوێنەشکاو(بیرەوەری) و وەرگێڕانی کتێبی کـورد و کوردستانی واسیلی نیکیتین لە فارسی بۆ کوردییە. هیواداریـن ئەو شـاعیرە تـەمـەنێکی زۆری تر بژی و هەروەها خزمەت بە کولتوور و ئەدەبی نەتەوەکەی بکا.

## بەشی دووهەمی

## خوێندنەوەی وانەی ٩

# رەشید فندی

لێکۆڵەر و ئەدیبی کورد «رەشید فندی» لە ساڵی ١٩٤٨ لە شاری دهۆک لە دایکبووە و خوێندنی خۆی لە شارەکانی : دهۆک، هەولێر و سلێمانی و مووسڵ تەواو کردووە و لە ساڵی ١٩٧١ بووەتە ئەندامی یەکیەتی نووسەرانی کورد و هەر ئێستا ئەندامی کۆڕی زانیاری کوردە. ئەو مامۆستایە لە بواری لێکۆڵینەوەی ئەدەبی هەوڵێکی زۆری داوە و تا بە ئێستا ئەم کتێبانەی بە چاپ گەیاندووە :

١- چەند تیرۆژێک لە سەر رۆژنامەگەریی کوردی.

٢- عەلی تەرماخی یەکەمین رێزماننووسی کورد.

٣- ئەلهوو بلند فرێت (هەڵۆ بەرز دەفرێ) کە لێکۆڵینەوەیەکە لە سەر شێعرە نەتەوایەتییەکانی مامۆستا هەژار.

٤- کتێبێک لە سەر شێعری کلاسیکی کوردی.

٥- کتێبێک بە زمانی عەرەبی لەبارەی خانیدا.

# تمرینات در س ۹

۱ـ مشخص کنید در میان واژه‌های زیر کدامیک مستقل و کدامیک ناقص است.

**ترێ ـ شەو ـ بە ـ ندە ـ هەژار ـ بێ ـ هەڵ ـ کار ـ ان**

**میوان ـ پیاو ـ کچ ـ دا ـ تر ـ چاو ـ ئازا ـ گەر ـ چوار**

واژه مستقل: **شەو**

واژه ناقص: **بێ**

۲ـ در کلمات مرکب زیر واژه‌های مستقل و ناقص را مانند نمونه از یکدیگر جدا کنید :

**ئاورە سوورە : ئاور + ە + سوور + ە**

| | | |
|---|---|---|
| **لێدان** | **کرێکار** | **خوێندەوار** |
| **بێکار** | **ئاسنگەر** | **ئاشەوان** |
| **کرچوکاڵ** | **زۆردار** | **بریندار** |
| **خەو لێکەوتن** | **جوانتر** | **چاوپێکەوتن** |

۳ـ عباراتی را که از نظر سرهم و جدانویسی نادرست هستند بصورت درست بنویسید.

ـ حەسەنوکەریم پێکەوە بران.

ـ شنۆ خۆش‌ترین و کۆن‌ترین شاری ئازربایجانی رۆژاوایە.

ـ بارام دوێنێ بە وێ دا رۆیی.

ـ کاوە زۆری لە براکەیدا.

ـ خەم سەری لێدام و یارم قەت سەرێکی لێ نەدام.

ـ عیل لەتی دەردو دەواکەم وا بە لێوی شەککەرە

ـ لێدوان ووت وێژێکی زۆرمان لەو بارە دا ئەنجامدا.

ـ لەگەڵم زۆر گەرم و گوڕ بوو.

ـ حەوزەکەی بۆکان قوولو بێ بنە دوو ماسی تێ دا خاڵ لە گەردنە

ـ لەو بارەیەوە شتێکیتر نازانم باش تر وایە لە ئازاد بپرسی.

# سجاوندی (نشانەگذاری)

مقصود از «نقطەگذاری» یا «سجاوندی»، به کار بردن علامت‌ها و نشانه‌هایی است، که خواندن و فهم درست مطالب را آسان می‌کند و در رفع بعضی ابهامات کمک می‌نماید.

**١ـ خاڵ = نقطه** (.)

نقطه در موارد زیر به کار برده می‌شود:

الف ـ در پایان جمله‌های کامل خبری یا انشایی، مانند:

ـ حسن، یکی از شاگردان خوب کلاس است.

ـ حەسەن، یەکێک لە قوتابییە باشەکانی پۆلە.

مبادا که ماشین تو را زیر بگیرد.

نەوەک ماشین وەبەرت دا.

ب ـ پس از هر حرفی که به صورت نشانه اختصاری به کار رفته مانند:

ک.د.(کریم دافعی)

سال ٤٥٨ ق.م. (قبل از میلاد مسیح)

سالی ٤٥٨ پ.ز (پێش زایین)

یادآوری: هرگاه دو جمله کامل با «و» به یکدیگر عطف شوند، نقطه در پایان جمله دوم گذاشته می‌شود مانند:

از دوستم آزرده خاطر بودم و به همین جهت به خانه او نرفتم.

له هاواڵەکەم تۆرابووم و بۆیە نەچوومە ماڵیان.

**۲ـ کۆما - ویرگول** (،)

ویرگول نشانهٔ توقف یا درنگ کوتاهی است که در موارد زیر به کار می‌رود:

الف ـ میان عبارت‌ها یا جمله‌های غیرمستقلی که در مجموع یک جمله کامل را تشکیل می‌دهند، مانند:

ـ پس از چند سال تنهایی، یک هفته پیش، با دختری ازدواج کرد.

ـ پاش چەن ساڵ تەنیایی، حەوتوویەک لەوە پێش، کچێکی مارە کرد.

ـ زمستان امسال، با برف و سرما فرا رسید.

ـ زستانی ئەوساڵ، بە بەفر و سەرماوە هات.

ـ آن جا که آب هست، آبادی هست.

ـ هەر جێیەک ئاوی بێ، ئاوەدانیشی دەبێ.

ـ هرکس ورزش کند، تندرست می‌شود.

ـ هەر کەس وەرزیش بکا، تەندروست دەبێ.

ـ روزه بگیرید، تا تندرست شوید.

ـ بەڕۆژوو بن، هەتا تەندروست بن.

ب ـ آن جا که کلمه یا عبارتی بـه عنـوان توضـیح در ضـمن جمله یا عبارتی دیگر آورده شود، مانند:

ـ دیروز، روز عید فطر، به تبریز آمدم.

ـ دوێنێ، رۆژی جێژنی رەمەزان، هاتمە تەورێز.

ـ سعدی، شاعر بلند آوازه، اشعار زیادی گفته است.

ـ سەعدی، شاعیری بەناوبانگ، شێعری زۆر کوتووە.

ج ـ آن جا که در مورد چند کلمه اسناد واحدی داده می‌شود. مانند:

حسن، احمد و علی برادرند.

حەسەن، ئەحمەد و عەلی بران.

ـ سعدی، حافظ و خواجو از شاعران بلند پایه هستند.

ـ سەعدی، حافز و خواجوو لە شاعیرە بەرزەکانن.

د ـ برای جدا کردن اجزای مختلف نشانی اشخاص یا مرجع و مأخذ.

ـ آقای علی رحیمی، دانشکده ادبیات، سال سوم.

**ـ ئاغای عەلی رەحیمی، زانکۆی ئەدەب، سالی سێهەم.**

ـ تبریز، خیابان امین، پاساژ کریمی، انتشارات یاران

**ـ تەورێز، شەقامی ئەمین، پاساژی کەریمی، ئینتیشاراتی یاران.**

ـ سعدی، گلستان، تصحیح دکتر خلیل خطیب‌رهبر، انتشارات صفی علیشاه، تهران ۱۳۶۳.

**ـ سەعدی، گولستان، ساغکردنەوەی دوکتور خەلیلی خەتیب‌رەهبەر، ئینتیشاراتی سەفی عەلیشا، تاران ۱۳۶۳.**

**۲ـ کۆمای خاڵدار ـ نقطه و ویرگول (؛)**

نقطه ـ ویرگول، علامت وقف یا درنگی است بیشتر از ویرگول و کمتر از نقطه که در موارد زیر به کار می‌رود:

الف ـ برای جدا کردن عبارت‌های مختلف یک جمله طولانی که ظاهراً مستقل و لکن در معنی با یکدیگر مربوط می‌باشند، مانند:

ـ مشک آن است که خود ببوید؛ نه آن که عطار بگوید.

ـــ میسک ئەوەیە بۆخۆی بۆنخۆش بێ، نەک عەتار پێی هەڵبڵێ.

ـ دوست واقعی آن است که یار شاطر باشد؛ به بار خاطر.

ـ دۆست ئەوەیە بتگرێنێ؛ دوژمن ئەوەیە پێتپێبکەنێ.

ب ـ در جملەهای توضیحی مانند:

ـ و قاصدی نزد او فرستاد؛ قاصدی عاقل و نکتەدان.

ـ قاسیدێکی ناردە لای؛ قاسیدێکی ژیر و قسەزان.

**٤ـ دوو خاڵ = دو نقطه** (:)

موارد استفاده از این علامت به شرح زیر است:

الف ـ وقتی میخواهند سخن کسی را نقل کنند، مانند:

علی از بازار آمد و گفت: انگور خوبی خریدەام.

عەلی لە بازارەوە هات و کوتی : ترێیەکی باشم کڕیوە.

ب ـ وقتی میخواهند چیزی را شرح دهند، مانند:

ما در مدرسه این درسها را میخوانیم: تاریخ، فارسی، حساب ...

ئێمە لە قوتابخانە ئەو وانانە دەخوێنین : مێژوو، فارسی، حیساب ...

ج ـ هنگام معنی کردن لغات، مانند:

اهمال : سستی

ئیهمال : سستی

ذکاوت : زیرکی

زەکاوەت : زیرەکی

**٥ـ جووت کەوان - علامت نقل‌قول یا گیومه** («...»)

این علامت موقعی به کار می‌رود که بخواهیم عین سـخن بـا نوشته کسی دیگر را بیاوریم، مانند:

آموزگارم می‌گفت : «درس‌هایت را خوب بخوان.»

مامۆستام کوتی : «وانەکانت باش بخوێنە.»

**٦ـ کەوان - پرانتز** ( )

وقتی می‌خواهیم مطلبی را توی جمله شرح بدهیم آن را توی پرانتز می‌گذاریم مانند:

ـ مجنون و لیلی (یکی از مثنوی‌های هفت اورنگ جامی) بـه تقلید از لیلی و مجنون نظامی سروده شده است.

**٧ـ نیشانەی پرسیار - علامت سؤال** (؟)

وقتی جمله صورت پرسشی (سؤال) را داشته باشـد، علامـت پرسش (؟) به کار می‌بریم. مانند :

ـ شما در کدام مدرسه تحصیل می‌کنید؟

ـ ئێوە لە کام قوتابخانە دەخوێنن؟

ـ من در مدرسه ایمان تحصیل می‌کنم.

ـ من لە قوتابخانەی ئیمان دەخوێنم.

ـ در کدام کلاس؟

ـ لە کام پۆل؟

ـ کلاس چهارم.

ـ پۆلی چوارەم.

**٨ـ نیشانەی سەرسوڕمان - علامت تعجب (!)**

این علامت نشانه تعجب است و برای حالات عاطفی، ندا، و تأکید و تحسین نیز بکار می‌رود مانند:

ـ عجب باغ دلگشایی است!

ـ چ باغێکی خۆشە !

ـ عجب خانه قشنگی است!

ـ چ خانوویەکی جوانە !

**٩ـ کۆمەڵە خاڵ - نقاط تعلیق (...)**

وقتی سخن به مناسبتی قطع شود یا ناقص بماند، برای نشان دادن بریدگی کلام باید نقاط تعلیق (....) به کار برد. چه در اول و چه در آخر عبارت باشد مانند:

ـ او دارای صفات حسنه‌ای نظیر شجاعت، سخاوت و... می باشد.

ـ ئەو خوو و خدەی باشی وەک : ئازایەتی، سەخاوەت و ... هەیە.

ـ ... و حالا تصمیم گرفته‌ام که به کسی ارفاق نکنم، همین یک بار کافی است که...

ـ ... ئیدی بڕیارم داوە چاکە لەگەڵ کەس نەکەم، هەر ئەو یەکجارە بەسە ...

خوێندنەوەی وانەی ١٠

## ناڵەی جودایی

کتێبی ناڵەی جودایی یەکێک لە دوو کتێبە شێعرەکەی سەید محەممەدئەمین(ی) شێخولئیسلامی ناسراو بە مامۆستا هێمن(ە) کە لە چەند پارچە شێعری مەسنەوی و غەزەل و دووبەیتی پێکهاتووە. بەرزترین شێعری ئەم دیوانە مەسنەوی ناڵەی جوداییە. شاعیر لەم شێعرەدا دەرد و ژانی دووری و جودایی لە زێد و مەڵبەند و خێزان و هاواڵانی بە شێوەیەکی بە سۆز دەربڕیوە. لێرەدا بەشێک لەم شێعرە بەرزە بۆ وێنە دێنینەوە :

کوردەواری ئەی وڵاتە جوانەکەم
ڕۆڵەکەم، باوانەکەم، خێزانەکەم
ئەی ئەوانەی قەت لەبیرم ناچنەوە
ئێستە بمبینن، ئەرێ دەمناسنەوە
ڕۆژگار هاڕیمی وەک ئەسپۆنی ورد
تاو و تینی لێبڕیوم دەردە کورد
دەردی دووری دەردی دووری کوشتمی
دەردی وشیاری و سەبووری کوشتمی
دەردی یاران و وڵاتی خۆشەویست
لێی بڕیوم سەبر و هۆش و تاو و بڕست
ناڵە ناڵم تێکەڵی مەی کردووە
شیوەنێکم پێیە نەی نەیکردووە

نالّـــه نالّـــی مـــن درمنگـــه زوو نییـــه
پارچـــه گۆشـــتێکه دڵـــی مـــن روو نییـــه
نالّـــه نالّـــی مـــن رەوایـــه زۆر رەوا
چـــونکی قـــانوونی تـــەبیعـــەت وایـــه وا
هر کسی کـو دور ماند از اصـل خـویش
بـاز جویـد روزگـار وصـل خـویش

# تمرينات درس ۱۰

متون و جملات زير را نشانه‌گذاری کنيد.

**سپینوزا □ فیلسووفێکی فەڕانسەیی دەڵێ □ □ ئێمە ئەگەر بمانەوێ مەسەلەی شەڕ چارەسەر بکەین □ زۆر هاسان گۆشەنیگامان دەگۆڕێ □ تێڕوانینەکانمان جیاواز دەبێت و لەوانەیە ئەو شەڕەی کە ماهیەتەکەیمان بە شەڕ لە قەڵەم دەدا □ بە چاکە وەرسووڕێ □ □ هەڵبەت ئەوە لە مێژوودا زۆر جار کەڵکی خراپی لێوەرگیرا□**

*(عەبدولخالقی یەعقووبی : سروەی ژمارە ۲۳۵)*

**بارام بە پیرۆتی کوت □ هاواڵی باش ئەوەیە بارت لێ سووک کا □ نەک بارت لێ قورس کا □**

**مامۆستا سەبک و شێوازی رۆمان‌نووسین لای ئێوە چییە □**

**□ من هەر لە سەرەتاوە باوەڕم وابووە □ کە سەروەری بۆ رۆمانی ڕیالیزمە □ کە ئەویش بێگومان زۆر شێوەی هەیە □**

*وتووێژێک لەگەڵ چیرۆکنووس حوسێن عارف*

*مستەفا ئیلخانی‌زادە*

*گۆڤاری □ سروە □*

*ژمارە ۲۱٦ □ بانەمەڕی ۱۳۸۳*

**ئازاد تاریفی کاوەی دەکرد و دەیکوت □ چەن پیاوێکی میهرەبانە □ هەموو کەس خۆشی دەوێ □**

**نالی □ ئەو وەحشی غەزالە کەس وەبەر داوی نەکەوت □**

**چونکە شاهێنی دووچاوی تیژە □ دایم سەر نەکا □**

**رێنووسی وانەی ١١**

*نکاتی را که باید در نوشتن یک متن رعایت کنیم :*

١ـ آنرا با رسم‌الخط (رێنووس) درست بنویسیم.

٢ـ نکات دستوری را رعایت کنیم.

٣ـ از نشانه‌های نگارشی استفاده کنیم.

٤ـ بهتر است جملات کوتاه باشند و تا می‌توانیم از بکار بردن جملات دراز خودداری کنیم.

٥ـ از نوشتن کلمات نامأنوس و مجعول خودداری کنیم.

٦ـ تا می‌توانیم از کلمات سره(پەتی) کُردی استفاده کنیم.

٧ـ بطور خلاصه در نگارش و نوشتن انشاء و مقالات این سه اصل مهم را رعایت کنیم :

الف : کوتاه و مختصر و مفید باشد.

ب : مقصود را به روشنی بیان نماید.

ج : ملال‌آور و خسته‌کننده نباشد.

خوێندنەوەی وانەی ١١

## سێ کەس لە شاعیرانی ئیلام و کرماشان و گۆران(ئەهلی حەق)

## *غوڵامرەزاخان(ی) ئەرکەوازی*

غوڵامرەزاخان خەڵکی ئەرکەوازی سەر بە ئیلامی پشتکۆیە لە دەورەی فەتحعەلیشای قاجاردا ژیاوە و راوێژکاری حەسەنخان(ی) والی پشتکۆ بووە. ئەم گەورەپیاوە لە ئەدەبی عەرەبی و فارسی و کوردی شارەزاییەکی تەواوی بووە و بەم زمانانە شێعری کوتووە. موناجات(پاڕانەوە)کەی ئەرکەوازی زۆر بە ناوبانگە و بە یەکێک لە موناجاتە هەرە باشەکانی ئەدەبی کوردی دەژمێردرێ. کۆچی دوایی ئەم گەورە پیاوە بە دروستی نەزانراوە.

## *شامی کرماشانی*

شامورادی موشتاق ناسراو بە (شامی کرماشانی) یەکێک لە شاعیرە باش و بەناوبانگەکانی ناوچەی کرماشانە. ئەو شاعیرە لە دەوروبەری ساڵی ١٣٠٠ ی کۆچی هەتاوی لە گەڕەکی چەنانی شاری کرماشان لە دایک بووە. ئەو شاعیرە لە تەمەنی سێ ساڵیدا بە هۆی نەخۆشی ئاوڵە(خور وێرکە) کوێر بووە و پاش ماوەیەکی کەم لەم رووداوە دایکیشی کۆچی دوایی دەکا و لە خۆشەویستی و لاواندنەوەی دایک بێبەش دەبێ و لە دوازدە ساڵیدا باوکیشی کۆچی دوایی دەکا و شاموراد تووشی ژیانێکی پڕ لە تاڵی و کوێرەوەری دەبێ. ماوەیەک لە ماڵی مامۆژنی و ماوەیەک لە ماڵی حاجی ئەمانوڵڵاخان(ی) موعتەزیدی دەبێ و هۆگری بە شێعری «مەلا

ئەڵماس‌خان» و «غوڵامرەزا پوور» و «سەید سەلاح» پەیدا دەکا و وردە وردە دەس بە شێعر کوتن دەکا. هەر لەو سەردەمانەدا، لە ماڵی ئەمانوڵڵاخان دێتە دەرێ و بۆخۆی خەریکی کاروکاسبی دەبێ. هێندێک لە شێعرەکانی شامی کۆکراونەوە و بە ناوی «چەپکە گوڵ» لە لایەن بڵاوکەرەوەی سرووش لە ساڵی ١٣٦٢ لە چاپ دراون و مامۆستا هەژار پێشەکیەکی جوان و بە نرخی بۆ ئەم دیوانە نووسیوە.
شامی گەرچی کۆچی دوایی کردووە بەڵام هەمیشە لە ناو دڵی گەلەکەی دایە. شێعرە درێژەکەی «کرانشینی» ویردی زمانی هەموو هەژاران و لایەنگرانی نەداران و ستەم لێکراوانە.

## سەید یەعقووب ماهیدەشتی (سەی یاقۆ)

ئەو شاعیرە کە لە هۆزی گۆران و پەیرەوی ئاینی «ئەهلی حەق»ە کە «یارسان» و «کاکەیی»شی پێدەکوترێ. مامۆستا عەلائەددین سەججادی لە کتێبی «مێژووی ئەدەبی کورد»دا مێژووی لە دایکبوونی سەی یاقۆی ١٣٢٨ کۆچی مانگی و ساڵی وەفاتی ١٣٠١ کۆچی مانگی نووسیوە. لە دێی قەمشە لە دایکبووە و گلکۆی هەر لەو دێیەیە. شێعرەکانی سەید بە شێوازی غەزەل و مەسنەوی و چوارخشتەکین و زۆر رەوان و جوان و پڕ مانان و بە زاراوەی گۆرانی و کەڵوڕی و سۆرانی کوتویەتی و لە چەند غەزەلدا پێشوازی (ئیستیقبال)ی لە شێعری نالی کردووە. سەی یاقۆ بە زمانی عەرەبی و فارسیش شێعری کوتووە. لێرەدا غەزەلێک لە غەزەلە جوانەکانی سەید دەخەینە بەر چاوی خوێنەران:

عەزیزان ماه روخساری ژ قەوسێ ئەبروان تیری
وە جەرگم ئاشنا کەردەن نەدارەم هیچ تەقسیری
وەناخون سینە شوم کەردم وەشانم توخمی مێهری ئەو
وەداس ئەبروان درویم جگەر کردم وەقەلبیری
سێ ساڵە پاسبانی کەم ژ دەورێ خەرمەنێ حوسنت
ژ سەد مەن خەرمەنێ گۆنا جەوی نادەی لە وەرزیری
ژ عەقڵ و عیشق حەیرانم نەزانم قەول کامین کەم
نە عیقشم پێم ئەدا موهڵەت نە عەقڵم کات تەدبیری
سەگی پاسی سەرایی سەرداران ئەدەن نانەش
من عومری پاسەبانیم کرد چلۆنە تۆ کە دڵگیری
روخی زیبای شیرین بی وەخوونێ کومکەن باعیس
وەها سەییاد تەڕ دەس بی (سەید) بەرچی وەنەخچیری

# چەند قسەیەک لەگەڵ خوێنەری ئەو کتێبە

فێربوونی خوێندنەوە و نووسینی زمانی زگماکی مافی هەموو کەسێکە. بۆیە فێربوونی زمانی کوردی بۆ هەموو کوردێک پێویستە. ئێستاکە ئێوە خوێندن و نووسینی زمانی کوردی بە باشی و بە شێوەیەکی زانستی فێربوون، ئەرکی سەرشانی هەمووتانە بۆ پەرەپێدانی زمانەکەتان، تێبکۆشن و هەر بەوە رازی نەبن ئێوە فێری خوێندن و نووسینەوەی کوردی بوون. بۆ ئەوەی باشتر شارەزای زمانەکەتان بن و ئەوەی فێری بوون لەبیرتان نەچێتەوە، پێویستە کتێبی بە کەلکی کوردی بخوێننەوە و تا دەتوانن بۆ هاواڵان و خزمانتان بە زمانی کوردی نامە بگۆڕنەوە و بۆ گۆڤار و رۆژنامە کوردییەکان وتار بنووسن و شت لە زمانەکانی دیکەڕا بۆ کوردی وەرگێڕن.

وەرگێران سوودی بۆ زمانەکەی خۆتان و زمانە بیانییەکە هەیە. هەروەها هەوڵ بدەن لە خولەکانی سەرتری فێرکاریی کوردی بەشداری بکەن و ئەو شتانەی فێری بوون، فێری هاواڵان و خزمانی بکەن و بەو کارە بە شێوەیەکی هەراو خزمەت بە پەرەپێدانی زمانی کوردی دەکەن.

تەنیا بە هەوڵ و تێکۆشانی هەموو لایەنە و دڵسۆزانە دەتوانین لە ماوەیەکی کەمدا، دواکەوتنمان لەو بوارەدا قەرەبوو بکەینەوە.

دەبێ ئەوەش بزانین فێربوونی خوێندن و نووسین و ئەدەبی زمانی زگماکی بۆ فێربوونی زمانەکانی دیکەش سوودی هەیە و هەرکەس رێنووس و رێزمانی زمانی زگماکی خۆی بە باشی بزانێ دەتوانی باشتر فێری رێنووس و رێزمان و ئەدەبی زمانەکانی دیکەش ببێ. بە تایبەت لەبەر ئەوەی زمانی کوردی و فارسی دوو زمانی هاوڕیشە و لێک نزیکن فێر بوون و زانینی هەریەک لەو دوو زمانە کاریگەرییەکی زۆری لەسەر فێربوونی زمانەکەی دیکە هەیە.

خزمەتکاری زمان و ئەدەبی کوردی : مستەفا ئێلخانیزادە

# خودآزمایی (۲)

۱ـ آیا همزه یک حرف صامت است؟ بلی ☐ خیر ☐

۲ـ آیا حرف (ی) در کلمه‌ی پەنیر صامت است؟ بلی ☐ خیر ☐

۳ـ آیا حرف (ی) در کلمه‌ی (کەی) مصوت است؟ بلی ☐ خیر ☐

٤ـ آیا حرف (و) در کلمه‌ی (کوڕ) صامت است؟ بلی ☐ خیر ☐

۵ـ حرف (ک) در کدامیک از کلمه‌های زیر کلۆر(اجوف) است؟

کاڵەک ☐ کیلە ☐ کاوڕ ☐ کارگ ☐

٦ـ حرف (گ) در کدامیک از کلمه‌های زیر پر است؟

گاڕان ☐ گیسک ☐ گیشە ☐ گوێز ☐

۷ـ تعداد حروف صامت در کلمه‌ی شاروێران کدام گزینه است؟

۵ ☐ ۳ ☐ ٤ ☐ ٦ ☐

۸ـ حرف (ل) در کلمه‌ی گوڵان درشت (قەڵەو) است؟ بلی ☐ خیر ☐

۹ـ حرف (ر) در کلمه‌ی گاڕان خفیف (لاواز) است؟ بلی ☐ خیر ☐

۱۰ـ حروف مصوت کلمه‌ی گوێلک کدام عدد است؟

۲ ☐ ۳ ☐

۱۱ـ کدام گزینه زیر طرز صحیح نوشتن (مذمّت) با تلفظ و رسم‌الخط کُردی است.

مذەمت ☐ مەذەممەت ☐ مەزەممەت ☐

۱۲ـ حروف مصوت کلمه‌ی ئەوێندار کدام گزینه است.

الف ـ هـ . و . ن . ١ ☐ ب ـ هـ . ێ . ١ ☐ ج ـ ئ . ێ . ١ ☐

کدامیک از عبارات زیر از نظر جدانویسی و سرهم‌نویسی صحیح نوشته شده است :

**بارام لە کورەکانی تر زیرەکترە، بە دڵگەرمی، وانەکانی دەخوێنێ و لەگەڵ پیرۆت و ئازاد، هەموو رۆژێ دەچنە بازاڕی ئاسنگەرەکان و گورجوگۆڵ دەگەڕێنەوە.**

**بارام لە کورەکانیتر زیرەک ترە، بە دڵ گەرمی، وانەکانی دەخوێنێ و لەگەڵ پیرۆتو ئازاد، هەموو رۆژێ دەچنە بازاڕی ئاسن گەرەکان و گورج و گۆڵ دەگەڕێنەوە.**

**بارام لە کورەکانی تر زیرەکترە، بە دڵگەرمی، وانەکانی دەخوێنێ و لەگەڵ پیرۆت و ئازاد، هەموو رۆژێ دەچنە بازاڕی ئاسنگەرەکانو گورج و گۆڵ دەگەڕێنەوە.**

در پاراگراف زیر نشانه‌های نگارشی را در داخل مربعها قرار دهید.

**وەک دەبینین نالی لە قەوارەی شیعرێکی عەرووزیدا ☐ لە قەوارەی شیعرێکی قافیەداردا ☐ کە هەموو دەزانین زۆر جار رەنگە شاعیر بکەوێتە ناو تەنگانە ☐ بە بۆنەی قافیەوە ☐چەندە بە شێوەیەکی رێکوپێک و بە شێوەیەکی جوانی ئاسانە باسی لە مەسەلەی چاو کردووە ☐**

**سپینۆزا ☐ فیلسووفێکی فەڕانسەیی دەڵێ ☐☐ئێمە ئەگەر بمانەوێ مەسەلەی شەڕ چارەسەر بکەین ☐زۆر هاسان گۆشەنیگامان دەگۆڕین ☐ تێروانینەکانمان جیاواز دەبێت و لەوانەیە ئەو شەڕەی کە ماهیەتەکەیمان بە شەڕ لە قەڵەم دەدا ☐بە چاکە وەرسووڕێ ☐☐هەڵبەت ئەوە لە مێژوودا زۆر جار کەڵکی خراپی لێوەرگیراوە ☐**